هەرێمی کوردستانی - عێراق
وەزارەتی پـــەروەردە
ب٠گ٠ پرۆگرام وچاپەمەنییەکان

# کۆمپیوتەر

# مایکرۆسۆفت وێرد و ئینتەرنێت

## بۆ پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی

**دانانی**

| | |
|---|---|
| روناك محمد عبدالله | ڕێزان حمەرەشید کریم |
| سۆران نەریمان حمەصالح | ئومێد صادق عبدالکریم |
| محمد ئەبوبکر تۆفیق | هادی حمەرەضا عزیز |

**پێداچوونەوەی زانستی و گونجاندن**

ابراهیم کریم سعید

چاپی نۆیەم ٢٠١٤ زاینی ٢٧١٤ کوردی

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

ئاشناکردنی خوێندکاری کورد بە کۆمپیوتەر وەك گەلانی پێشکەوتوو بەکارهێنانی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی هەنگاونانە بەرەو ئاسۆدوورەکانی پێشکەوتن و تەکنەلۆجیای سەردەم . .

لێرەوە دەتوانین بڵێین کە کۆمپیوتەر زۆربەی بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە، بۆیە جێگای دەست خۆشی یە کە (وەزارەتی پەروەردە)ی هەرێمی کوردستانی عێراقی فیدراڵ لە هەنگاونان بۆ گەشەدان و گۆڕانکاری لە پرۆگرامەکانی خوێندندا بڕیاری خوێندنی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێتی دا لە قۆناغەکانی خوێندندا و ئامێر وکەرستەی پێویستیشی بۆ دابین کرد، وەك تەواوکاریەك بۆ ئەو کارە ئەم پەرتووکە دەخەینە بەردەست قوتابیانی ئازیز بە هیوای سوود لێوەرگرتنتان.

# بەشی یەکەم




کۆمپانیای مایکرۆسۆفت یەکێکە لە کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهـان کـە داهێنـەری زۆر لـە بەرنامـەکانی کۆمپیوتـەرە کـە لـەژێر سیـستمی وینـدۆزدا کـار دەکـەن. Microsoft Office گروپێکـە لـە بەرنامەکـە کـە کارەکـان جێبـەجێ دەکـات، یـەکێك لـەو بەرنامانـە بەرنامەی (مایکرۆسۆفت وێرد Microsoft Word )ە .

ئەم بەرنامەیە تایبەتە بەنووسین کە تێیـدا نووسـین بـە هـەموو جۆرێك و دانانی وێنە و شێوەی جۆراوجۆر و دروست کردنی خشتە ئەنجام دەدرێت.

## چۆنیەتی کردنەوەی بەرنامەکە:

١. کلیك لەسەر Start دەکەین.

٢. نیشاندەر دەخەینە سەر All Programs یان Programs.

٣. لـە لیـستە کراوەکـە کلیـك لەسـەر Microsoft Word دەکـەین یـان نیشاندەر دەخەینە سەر Microsoft Office ئینجا کلیك دەکەین لەسەر Microsoft Word، وەك ئەم هێلکاری یە:



# رووکاری بەرنامەی Microsoft Word




١. Title Bar شریتی ناونیشان.

٢. Menu Bar شریتی لیستەکان.

٣. Standard Toolbar شریتی ئامرازیپێوانەیی.

٤. Formatting Toolbar شریتی ئامرازی ڕێکخستن .

٥. Task Pane بەشی ئەرکەکان .

٦. Drawing Toolbar شریتی ئامرازی وێنەکێشان.

٧. Satatus Bar شریتی حاڵەت.

# چۆنیەتی نووسین لە بەرنامەی (مایکرۆسۆفت وێرد) دا

## ١. بە ئینگلیزی :

جـۆری نووسـینەکە ئەگـەر عـەرەبی بـوو ئـەوا بـە داگرتنـی (Alt+Shift)ی لای چەپی کیبۆردەکە دەبێتە ئینگلیزی یان لەسەر شـریتی ( Task Bar ) بـە کلیـك کـردن ئـایکۆنی (Ar) دەگـۆڕین بـۆ (En) و لـەجۆری فۆنتـدا یـەکێك لـە فۆنتـە ئینگلیـزی یـەکان دیـاری دەکەین وەکو:

Times New Roman , ……

لەدوایدا بۆ نووسین پیتە ئینگلیزییەکانی سـەر کیبۆردەکە بـەکاردەهێنین و بەشـێوەی بـچووك (Small) دەنوسـرێن، ئەگـەر دەسـت بنـێین بـە دوگــمـەی(Caps Lock)دا ئـەوا پیتـەکان بـە گـەورە (Capital) دەنووسـرێن یـان دەسـت لـەسـەر دوگمـەی (Shift) هەڵنەگرین لەسەر کیبۆردەکە ئـینجا دەست بـنێین بـە پیتەکەدا ئەوا بـەشـێوەی گەورە (Capital) دەنووسرێت.

## ٢. بە کوردی و عەرەبی:

جـۆری نووسـینەکە ئەگـەر ئینگلیـزی بـوو ئـەوا بـە داگرتنـی (Alt+Shift)ی لای ڕاستی کیبۆردەکە دەبێتـە (کـوردی – عـەرەبی) یان لەسەر شریتی (Task Bar)، (En) دەکەین بە (Ar).

لە جۆری فۆنتدا بۆ زمانی عەرەبی دەبێت ئەو فۆنتانـە دیـاری بکـەین کە لەسەر شێوەی (Ali_A)ن وەکو:

Ali_A_Jiddah , Ali_A_Samik , ……

بەڵام بۆ زمانی کـوردی لـە جۆری فۆنتـدا دەبێـت ئـەو فۆنتانـە دیـاری بکەین کە لەسەر شێوەی (Ali_K)ن وەکو:

Ali_K_Jiddah , Ali_K_Samik , ……

وە چەندین جۆرە فۆنتی تری کوردی و عەرەبی هەیە، وەك:

- فۆنتەکانی گرووپی (Zanest)
- فۆنتەکانی گرووپی (AF)
- فۆنتەکانی گرووپی (PG)
- فۆنتەکانی گرووپی (Zheayr)
- فۆنتەکانی گرووپی (Dylan) ...................هتد

هەروەها بۆ نووسینی کوردی سوود لە پیتە عەرەبی یەکانی سەر کیبۆردەکە وەردەگرین تەنها چەند پیتێک نەبێت کە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت بەم شێوەیە:

| پیتی سەر کیبۆرد | پیتی کوردی |
|---|---|
| ث | پ |
| ض | چ |
| ط | گ |
| ظ | ڤ |
| ؤ | ۆ |
| ذ | ژ |
| ة | ه |

# تێبینی:

| بەکارهێنانی | دوگمەکان |
| --- | --- |
| بۆ دانانی فاریزە | Shift + K |
| بۆ دانانی خاڵ | Shift+ ز |
| بۆ دانانی ٚ لە زمانی کوردی و **الفتحة** لە زمانی عەرەبی | Shift + Q |
| بۆ دانانی ٖ لە زمانی کوردی و **الكسرة** لە زمانی عەرەبی | Shift + A |
| بۆ دانانی **الضمة** | Shift + E |
| بۆ دانانی **السكون** | Shift + X |
| بۆ دانانی **الشدة** | Shift + ذ |
| بۆ دانانی **تنوين الضمة** | Shift + R |
| بۆ دانانی **تنوين الفتحة** | Shift + W |
| بۆ دانانی **تنوين الكسرة** | Shift + S |
| بۆ دانانی **المدة** ( ~ ) | Shift + Z |

# شریتی ئامرازی گونجاندن Formatting Toolbar



Ali_K_Sahifa Bold بۆ گۆڕینی جۆری نووسین بەکاردێت .

١٦ بەکاردێت بۆ گۆڕینی گەورەیی وبچووکی قەبارەی فۆنت.

AR بەکاردێت بۆ گۆڕینی زمانی نووسینەکە. (Alt +Shift)

B بەکاردێت بۆ تۆخ کردنی نووسین. (Ctrl +B)

I بەکاردێت بۆ لار کردنی نووسین. (Ctrl +I )

U بەکاردێت بۆ دانانی هێڵ لەژێر نووسیندا. (Ctrl +U )

بەکاردێت بۆ گۆڕینی جێگای نووسینەکە بۆ لای چەپ.

(Ctrl +L )

بەکاردێت بۆ گۆڕینی جێگای نووسین بۆ ناوەڕاستی لاپەڕەکە.

(Ctrl +E )

بەکاردێت بۆ گۆڕینی جێگای نووسینەکە بۆ لای ڕاست.

(Ctrl +R )

بەکاردێت بۆ ڕێك کردنەوەی کۆتایی دێڕەکان بە مەرجێك نیشاندەرەکە بە Enter نەهاتبێتە خوارەوە.

(Ctrl +J )

بـــەکاردێت بـــۆ دوورخـــستنەوەی پیتـــەکانی نووســـینەکە لەیەکتر.

بـــەکاردێت بـــۆ فراوانکـــردن و تەســـککردنەوەی بـــەینی دێڕەکانی نووسینەکە.

بەکاردێت بۆ گۆڕینی ئاراستەی لاپەڕەی نووسین بۆ لای چەپ واتە بۆ ئینگلیزی ( Ctrl +Shift) لای چەپ.

بەکاردێت بۆ گۆڕینی ئاراستەی لاپەڕەی نووسین بۆ لای ڕاست واتە بۆ کوردی وعەرەبی (Ctrl+Shift) لای ڕاست.

بـــەکاردێت بـــۆ دانـــانی زنجـــیرەی ژمـــارە بـــۆ دێڕەکـــانی نووسینەکە.

بەکاردێت بۆ دانانی هێما بۆ دێڕەکانی نووسینەکە.

بەکاردێت بۆ بردنی نووسین بۆ لای ڕاست .

بەکاردێت بۆ بردنی نووسین بۆ لای چەپ.

بەکاردێت بۆ دانانی چوارچێوە بۆ نووسین.

بەکاردێت بۆ دانانی ڕەنگ بۆ ڕووتەختی نووسینی دیاری کراو.

بەکاردێت بۆ گۆڕینی ڕەنگی نووسینەکە.

## شـــريتی ئامرازی پێوانەیی Standard Toolbar



| | |
|---|---|
| | بۆ دروستکردنی فایلی نوێ (Ctrl + N) |
| | بۆ کردنەوەی فایلی داکراو (Ctrl + O) |
| | بۆ داکردن (زەخیرەکردن) (Ctrl + S) |
| | تایبەتە بە(ئیمەیڵ)واتە پۆستی ئەلیکترۆنی لە ئینتەرنێتدا. |
| | بۆ گەڕان (Windows + F) |
| | بۆ چاپکردن (Ctrl + P) |
| | بۆ پیشاندان پێش چاپکردن (Ctrl + F2) |
| | بۆ چاککردنی هەڵەی ڕێزمانیو ڕێنووسی لە نووسینی ئینگلیزیدا F7 |
| | بۆ بڕین (Ctrl + X) |
| | بۆ لەبەرگرتنەوە (Ctrl + C) |
| | بۆ لکاندن (Ctrl + V) |
| | بەخشەری سیفەتی بەشی هەڵگیراو |
| | پەشیمانبوونەوە لە هەنگاوی پێشتر (Ctrl + Z) |

| | |
|---|---|
| بۆ گەڕانەوە بۆ هەنگاوی پێشتر (Ctrl + Y) | |
| بۆ لکاندن (Ctrl + K) | |
| بۆ پیشاندان ولابردنی شریتی ئامرازی (Tables and Borders) | |
| بۆ دروستکردنی خشتە بەکاردێت | |
| بۆ چوونە ناو بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ | |
| بۆ دابەشکردنی نووسینی ناو لاپەڕەکانی فایلەکە بۆ چەند ستونێك . | |
| بۆ پیشاندانو لابردنی شریتی وێنەکێشان | |
| بۆ پیشاندانو لابردنی ئەو لیستەی کەلەلای چەپی لاپەڕەکە دروست دەبێت. | |
| بۆ پیشاندان و لابردنی Paragraph Marks | ¶ |
| بۆ پیشاندانی لاپەڕەی نووسین بە گەورەتر یان بچووکتر | %١٠٠ |
| یارمەتی F1 | |

# شريتى ليستەكان Menu Bar

## ليستى File

### * New دروستكردنى فايلى نوێ :




لەكاتێكدا بەرنامەی مايكرۆسۆفت وێرد دەكەينەوە راستەوخۆ فايلێكى نوێمان دەداتێ دەتوانين كارى مەبەستى تيادا ئەنجام بدەين ، يان كاتێك كار لەفايلێكدا دەكەين و دەمانەوێت راستەوخۆ فايلێكى ترمان بداتێ دەچين بۆ ليستى File كليكى New دەكەين فايلێكى نوێمان دەداتێ يا لەسەر شريتى Standard كليكى ئايكۆنى New دەكەين يان( Ctrl + N ) بەهەمان شێوە فايلێكى نوێمان دەداتێ دەتوانين كارى تێدابكەين و دابكەين.

## * Save زەخیرە کردنی فایل:

کەفایلێکی نوێمان کردۆتەوە بۆ پاراستنی فایلەکەمان و بۆ مانەوەی پێویستە (Save) بکەین لە کۆمپیوتەرەکەماندا بەم شێوەیە:

سەرەتا لەفایلە نوێکە دا لەپاش دابەزاندنی زانیارییەکان دەچینە سەر لیستی File و دواتر بۆ سەر Save کلیکی دەکەین یان لەسەر شریتی ئامرازی Standard کلیکی ئایکۆنی Save دەکەین یان لە کیبۆرد (Ctrl + S) دادەگرین، بۆکسێکمان بۆ دەکاتەوە کە لێرەدا لە Save in دا ئەو درایڤە دیاری دەکەین کە فایلەکەمانی تێدا زەخیرە دەکەین(دادەکەین) هەروەك لە بۆکسەکەدا دەرکەوتووە کە لە ناو درایڤی (D)دا فایلەکەمان دادەکرێ و لە هەمان کاتدا دەتوانین بەپێی ویستی خۆمان لە ناو هەر درایڤێکی تری ناو هاردەکە یان لە ناو(FlashDisk) دا دایبکەین.



کاتێك کە یەکەم جارە فایلەکەمان دادەکەین دەبێت ناوێکی نوێی بۆدابنێین ونابێت لەهەمان درایڤدا هەمان ناو هەبێت، لەم کاتەدا لە File Name دا ناوەکە دەنووسین دواتر کلیکی Save دەکەین فایلەکەمان دادەکرێت لەناو کۆمپیوتەرەکەدا، دەتوانین بە بەردەوامی رۆژانە بیکەینەوەو کاری تێدا ئەنجام بدەین و پاش هەرگۆڕانێك دەبێت کلیك لەسەر ئایکۆنی Save بکەینەوە بۆ دابەزینی گۆرانکارییە تازەکەو داکردنی.

## * Open کردنەوەی فایلی داکراو:

لەپاش داکردنی فایل رۆژانە ئێمە پێویستمان بەکردنەوەی دەبێت بۆ زیاترکردنی زانیاری یان خوێندنەوەی یان هەر کارو مەبەستێکیتر، لەم کاتەدا دەچین بۆ لیستی File کلیکی Open دەکەین یان بەهۆی کیبۆرد ( Ctrl+O ) دادەگرین یان لەسەر شریتی ئامرازی Standard کلیکی ئایکۆنی Open دەکەین لەهەموو بارەکاندا یەك بۆکسمان بۆدەکاتەوە، لە Look in دا ئەو درایڤە دیاریدەکەین کە فایلەکەمان تێدا داکردووە.



بەهۆی دەستنیشان کردنی ئەو فایلەی کە دەمانەوێت بیکەینەوە یان نوسینی ناوی فایلەکە لە File Name دا وبەکلیك کردن لەسەر Open ڕاستەوخۆ فایلەکەمان بۆ دەکاتەوە.

**تێبینی:**

١. لەکاتێکدا فایلێکی نوێمان کردۆتەوەو ئەوەی مەبەستمان بووە نوسیومانە بەڵام لەبیرمان چووە دایبکەین ، لێرەدا کەفایلەکە یان بەرنامەکە دادەخەین، کۆمپیوتەر ئاگادارمان دەکاتەوە ئایا دایدەکەین یان نا لەم کاتەدا ئەگەر کلیکی سەر Yes بکەین ڕاستەوخۆ بۆکسی Save دەکاتەوە ناوی دەنێین و دایدەکەین.




٢. کاتێك بمانەوێت فایلێك دوو جار دابکەین هەریەکەو بە ناوێکەوە یان لە درایڤێکی تردا دووبارە دایبکەینەوە یان بمانەوێت کە فایلێك پاش کردنەوەی ئەو گۆڕانەی تێیدا کردوومانە دایبکەین بە ناوێکی ترەوە بۆئەوەی فایلە کۆنەکەش بمێنێت ئەوا لە لیستی File دا کلیکی سەر Save As دەکەین بۆکسێك دەکرێتەوە بەهەمان شێوەو ڕێگەی پێشوو دایدەکەین.

*Close : ئایکۆنی داخستن بەمەش فایلی کراوە دادەخرێت.

*Save As Web Page : داکردنی فایل وەك ڕووپەڕی وێب، کە وەك فایلێکی ناو ئینتەرنێتی لێ دێت .

*Search : بەکاردێت بۆ گەڕان بەدوای فایلدا.

*Web Page Preview: پیشاندانی فایلی مەبەست وەك ڕوپەڕی ئینتەرنێت.

## *Page Setup ئامادەکردنی پەڕە:

کە نوسراوێك دەنووسین پێویستە لاپەڕەکەی بۆئامادە بکەین




کە ئایا قەبارەی چەند بێت و پەراوێزی لاپەڕەکەمان چەند بێت بۆ ئەم مەبەستە لە لیستی فایلدا دەچین کلیکی Page Setup دەکەین وبۆکسێکمان بۆ دەکاتەوە لەبەشی Marginsدا پەراوێزی لاپەڕەکەمان دیاری‌دەکەین کە دووری نوسراوەکەمان لە چێوەی لاپەڕەکەمانەوە تاچەند دوور بێت وپەراوێزی هەر چوار لای لاپەڕەکە دیاری دەکەین

(Top سـەرەوە، Bottom خـوارەوە، Left چـەپ، Right راسـت) بـەزیادکردنی هەریـەك لـەم بەشـانە پەراوێزەکـە زیـاد دەکـات وە بـە کەمکردنـەوەیان پەراوێزەکـە کـەم دەکـات، وە کاتێـك لاپەرەکـە لەلایەکییـەوە دەرزی لێـدەدرێت یـان دەکەوێتـە بـەینی فایلـەوە، پێویـستە لـەو لایـە مـاوەی بـۆ بـەجێبهێڵین کـە لـە Gutter دا پەراوێزەکـەی بـۆ دەنووسـین و لـە Gutter position شـوێنی پەراوێزەکە دیاری دەکەین کە بکەوێتە چ لایەکی لاپەڕەکە.

وە بۆ نووسین لەباری ئاسۆیی یان لەباری ستونی لاپەڕەکە Orientation دەکەینـەوە کـە ئەگـەر کلیـك سـەر Portrait بکـەین ئەوا نووسین دەکەوێتە سەر باری ستوونی لاپەڕەکە، وئەگەر کلیك لـە سـەر Landscape بکـەین نووسـین دەکەوێتـە سـەر بـاری ئاسۆیی.

لێرەدا ئێمـە هـەرگۆرانێك دەکـەین لـە ئامادەکردنی لاپەرەکـە لەبەشی Preview راستەوخۆ پیشانمان دەدات.

لە بەشی Paper ی بۆکسەکە قەبارە وجۆری لاپەرەکە دیاری دەکەین کە لە Paper Size دا چەند جۆرێکی لاپەڕەی تێدایە لە(A4, A3,...) دەتوانین یەکێکیان هەڵبژێرین، لەهەمان کاتدا دەتوانین خۆمان قەبارەی لاپەرە دیاری بکەین کە لە Width پانتایی لاپەرەکە دیاری دەکەین وە لە Height بەرزی یەکەی دیاری بکەین.




لەدوای دیاری کردنی پەراوێز و قەبارەی لاپەرە کلیکی سەر OK دەکەین، دەبینین لاپەرەکەمان بەو شێوەو جۆرەی لێهاتووە کە ویستومانە و ئامادەمان کردووە.

## * Print Preview بینین پێش چاپکردن:

پاش نووسینی بابەتی مەبەست باشتر وایە ببینین پێش چاپکردن تابزانین لە چاپدا چۆن دەردەچێت ئەویش بە کلیک کردن لەسەر Print Preview.

## * Print چاپکردن:

ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆچاپکردنی نووسراوەکانمان، کە فەرمانەکەی لە لیستی فایلو سەر شریتی ئامرازی Formatting دا هەیە کلیك دەکەین بۆکسێکمان بۆدەکاتەوە، لە Name دا ناوی جۆری ئامێری چاپکردن دیاری دەکەین کەدەبێت پێشتر بە کۆمپیوتەرەکەمان ناساندبێت.

بۆچاپکردنی هەموو لاپەرەکانی فایلەکەمان کلیکی سەر All دەکەین، هەروەها بۆ چاپکردنی تەنها ئەو لاپەرەیەی کەدیارە و نیشاندەرەکە تێدایە کلیکی سەر Current Page دەکەین، هەروەها بۆ چاپکردنی چەند لاپەرەیەك کە خۆمان دیاریدەکەین لە کوێ تاکوێ بێت ئەوا کلیکی سەر Pages دەکەین دواتر لە خانەکەیدا ئەو ژمارەیەی دەمانەوێت تا ئەو ژمارەیەی مەبەستمانە دەینوسین بۆنمونە لە لاپەرە ٨ تاوەکو ٣٤ چاپ بکەین ئەوا دەنوسین (٨-٣٤). لە NumberofCopies ژمارەی ئەو دانانە دەنووسین کە دەمانەوێت. دواتر کلیك لە سەر OK دەکەین بۆ جێبەجێبوونی فەرمانەکەمان.




* **Exit :** بۆ دەرچوون لەبەرنامەکە.

# لیستی Edit

کاتێك كلیك لەسەر Edit دەكەین لیستێك دەردەكەویت بەم شێوەی خوارەوە :

Edit View Insert Format
Undo Typing Ctrl+Z
Repeat Typing Ctrl+Y
Cut Ctrl+X
Copy Ctrl+C
Office Clipboard...
Paste Ctrl+V
Paste Special...
Paste as Hyperlink
Clear
Select All Ctrl+A
Find... Ctrl+F
Replace... Ctrl+H
Go To... Ctrl+G
Links...
Edit Picture

* Undo: پەشیمانبوونەوە لە هەنگاوی پێشتر..

* Redo: گەڕانەوە بۆ هەنگاوی پێشتر .

* Cut: بۆ بڕینی بەشی دیاری كراو.

* Copy: بۆ لەبەرگرتنەوەی بەشی دیاری كراو.

* Clear: بۆ سڕینەوەی بەشی دیاری كراو.

* Select All: بۆ دیاری كردنی هەموو ناوەڕۆكی فایلەكە.

* Find: بۆ دۆزینەوە بەكاردێت، كاتێك لە وشەیەك دەگەڕێیت لە نێوان نووسراوێكی زۆر لە فایلێكدا، ئەوا ئەو وشەیە لە Find What دا دەنووسیت

و پاشان کلیك لـەسـەر Find Next دەکـەیت بـەزووترین کات وشەکە دەدۆزێتەوە ودیاری دەکات.




*** Replace:** واتـە گـۆڕین بـە کلیـك کـردن لەسـەر Replace ئـەوا بۆکسی Find and Replace دەکرێتـەوە یـان بـە هـۆی داگرتنـی دوگمـەی ( Ctrl + H )، کـە لـە دوو بۆشـایی پێـك هـاتووە بۆشـایی یەکـەم Find What لـێرەدا ئـــەو وشـــەیە دەنـــوسین کە دەیگۆڕین لە بۆشایی دووەمدا کـە نووسراوە Replace With ئـەو وشـەیە دەنووسـین کـە دەچێتە شـوێن وشـەی یەکـەم پاشـان کلیـك لەسەر Replace دەکەین، وە بۆ گۆڕینەوەی هەموو (وشـەی یەکـەم) لە ناو فایلەکە ئەوا کلیك لەسەر Replace All دەکەین.

* Go To: ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ ڕۆیشتن بۆ لاپەڕەیەکی دیاری کراو وە کۆمەڵێك فەرمانی تر.

بۆنمونە ئەگەر فایلەکەمان پێك هاتبێت لە ٨٤ لاپەڕە بمانەوێت بچین بۆ لاپەڕە ٢٤ ئەوا لە بۆکسی Find and Replace کە بە کلیك کردنی فەرمانی Go To لە لیستی Edit یان بە داگرتنی دوگمەی ( Ctrl + G ) دەکرێتەوە، لە بەشی Go To What دا فەرمانی Page هەڵدەبژێرین ولە بەشی Enter Page Number دا ژمارە (٢٤) دەنوسین وکلیك لەسەر Go To دەکەین دەبینین ڕاستەوخۆ دەچینە لاپەڕە (٢٤).



# لیستی View

کاتێـك کلیـك لەسـەر لیـستی View دەکـەین کۆمـەڵێك فـەرمان دەردەکەوێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە:




* Normal: ئەو لاپەڕەیە بەشێوەیەکی ئاسایی دەردەکەوێت.

* Web Layout: وەك لاپـەڕەکی وەك ئینتەرنێت.

* Print Layout: ئەو لاپەڕەیـە بـە جۆرێك پیشاندەدرێت کە لەکاتی چاپ کردندا دەردەکەوێت.

* Outline: لاپەڕەکـــە بەشـــێوەیەکی درێژکراوەیی دەردەکەوێت.

* Task Pane: بۆ پیشاندان و لابردنی بەشی ئەرکەکان.

* Toolbars: بۆ پیشاندان و لابردنی شریتی ئامرازەکان.

* Ruler: بـۆ پیـشاندان و لابردنـی ڕاسـتەی لای چـەپ و سـەرەوەی لاپەڕەکە.

* Document Map: بـۆ پیـشاندان و لابردنـی ئـەو لیـستەی کـە لەلای چەپی لاپەڕەکە دروست دەبێت.

* **Header and Footer**: لەکاتێکدا بمانەوێت نووسراوێك یان وێنەیەك لە سەرەوەی یان لەخوارەوەی هەموو لاپەرەیەك دووبارە بێتەوە لێرەدا کلیك لە سەر Header and Footer دەکەین کە لە لاپەڕەکەدا لەناو بەشی (Header)دا ئەو نووسینە دەنووسین یان ئەو وێنەیە دادەنێین کە دەمانەوێت لەسەرەوەی هەموو لاپەڕەکانی فایلەکەدا دووبارە بێتەوە، و لەبەشی (Footer)دا ئەو نووسینە دەنووسین یان ئەو وێنەیە دادەنێین کە دەمانەوێت لەخوارەوەی هەموو لاپەڕەکانی فایلەکەدا دووبارەبێتەوە.
لە دواییدا کلیك لەسەر (Close) دەکەین لە شریتی ئامرازی (Header and Footer)دا.

* **Full Screen** : لەکاتێکدا بمانەوێت لاپەڕەکەمان پڕبە شاشە دەربکەوێت بەبێ پیشاندانی شریتەکان ئەوا کلیك لەسەر Full Screen دەکەین وە بەکلیك کردن لەسەر (Close Full Screen) یان دووگمەی Esc ئەوا لاپەرەکە دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی.

* **Zoom**: بۆ پیشاندانی لاپەڕەی نووسین بە گەورەتر یان بچووکتر.

# لیستی Insert

## * Page Numbers: دانانی ژماره بۆ لاپەرە




کاتێك کتێبێك یان ڕاپۆرتێك دەنووسین یان هەر بابەتێکی تر ئەوا پێویستە ژمارەی لاپەڕەی بۆ دابنێین، بۆ ئەم مەبەستە کلیك لە لیستی Insert دواتر کلیك لە Page Numbers دەکەین، و بۆکسێك دەبێتەوە، بۆ دیارکردنی شوێنی ژمارەی لاپەڕەکە لە Position دیاری دەکەین کە بکەوێتە خوارەوەی لاپەرە Bottom of page یان سەرەوەی لاپەرە Top of page وە بۆ دیاری کردنی ژمارەی لاپەرە بکەوێتە چ لایەکی لاپەڕەکە ( Right ڕاست، Left چەپ، Center ناوەڕاست، Inside ناوەوە، Outside دەرەوە) ئەوا لە Alignment دیاری دەکەین.



تێبینی:

بەشی Show Number on First Page بەکاردێت بۆ پیشاندان یان لابردنی ژمارەی لاپەڕەی یەکەم.

پاش دیارکردنی ئەو زانیارییانەی سەرەوە کلیک لەسەر (OK) دەکەین.

## * Date and Time: دانانی بەروار و کات

بەروار و کات پێویستی یەکی بەردەوامە بۆسەر نوسراوەکانمان، لە کۆمپیوتەردا ئاسانکاری تەواوی بۆکراوە، بۆ ئەم مەبەستە لە لیستی Insert کلیک لەسەر Date and Time دەکەین بۆکسێکمان بۆ دەکرێتەوە، ئەگەر لە Language دا Arabic هەڵبژێرین ئەوا بەزمانی عەرەبی بەروار و کاتەکەمان دەداتێ وە ئەگەر English




هەڵبژێرین ئەوا بەزمانی ئینگلیزی بەروار و کاتەکەمان دەداتێ.

بەڵام ئەگەر لە Calendar type دا Western هەڵبژێرین ئەوا بەروارەکەمان بە ساڵی زاینی دەداتێ وئەگەر Arabic Hijri

هەڵبژێرین ئەوا بەروارەکەمان بەساڵی کۆچی دەداتێ، هەروەها لە Available formats چەند جۆرێکی لە بەروارو کات تێدایە بۆ دابەزاندنیان بۆسەر لاپەرەکەمان بەدیاری کردنی هەرکامیان وپاشان کلیك لەسەر OK ئەوا بەروارەکەمان بەو شێوەیە دەنووسرێت.

## * Auto Text: نوسینی ئامادەکراو

کە رۆژانە بە بەردەوامی کاردەکەین لەسەر کۆمپیوتەر زۆرجار چەند وشەیەك یان رستەیەك لە نووسیندا دووبارە دەبێتەوە، جا لەم بارەدا لە Auto Text دا چەند نووسراوێکی ئامادەکراو هەیە یان دەتوانین خۆمان نوسین ئامادەبکەین بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە لە لیستی Insert دا کە دەچینە سەر Auto Text لیستێك دەکاتەوە کە چەند نووسراوێکی ئامادەکراوی تێدایە بە کلیك کردنی سەر هەریەکێکیان دادەبەزێتە سەر لاپەرەکەمان.




ئەگەر ئێمە بمانەوێت خۆمان نوسینێکی تێدا ئامادەبکەین و رۆژانە بەکاری بهێنین ئەوا کلیکی سەر Auto Text دەکەین بۆکسێکمان بۆدەکاتەوە کە لە Enter Auto Text entries here دا ئەوەی مەبەستمانە

دەینوسین بۆ نمونە (وەزارەتی پەروەردە) دواتر کلیکی سەر Add دەکەین، لە لیستەکەماندا دەبینین چۆتە بەشی Normal کلیکی دەکەین یەکسەر دەنووسرێت.

هەروەها پاش دانانی دەقی ئامادەکراو لەسەر لاپەڕەکە، دەتوانین بیان سڕینەوە ئەویش بە دیاری کردنیان پاشان کلیك لەسەر Delete دەکەین.

## * Symbol: هێما

بۆ دابەزاندنی هێما بۆ ناو ئەو لاپەڕەیەی کە مەبەستمانە لە لیستی Insert دا کلیك لەسەر Symbol دەکەین بۆکسێك دەکرێتەوە بە دیاری کردنی هەریەك لە هێماکان دواتر کلیکی Insert هێماکە دادەبەزێتە سەر لاپەڕەکە.



## * Picture: دابەزاندنی وێنە

بەرنامەی مایکرۆسۆفت وێرد لەکاتێکدا تایبەتە بە نووسین و نەخشەسازی نووسین لەهەمان کاتدا دەتوانین وێنە دابەزێنینە ناو ئەو لاپەڕەیەی کە مەبەستمانە بۆ ئەنجامدانی نیشاندەر دەخەینە سەر Picture لیستێك دەبێتەوە کە چەندین شێوەو ڕێگەی دانانی وێنەی تێدایە، بەم جۆرە:




١) Clip Art: بە کلیك کردنی وەك ویندۆیەك دەبێتەوە لەلای ڕاستی شاشەکەوە پاشان کلیکی سەر Search دەکەین بۆکسی وێنەکان دەکاتەوە بە کلیك کردنی هەریەك لە وێنانەکان دادەبەزێتە سەر لاپەڕەکە بۆ وێنەی ئەم کۆمپیوتەرە کە دانراوە.



٢) From File : كليكى دەكەين بۆكسێك دەكرێتەوە لە Look in ئەو درایڤە یان ئەو فۆڵدەرە دیاری دەكەين كە دەمانەوێت وێنەكەی لىٚ وەربگرين پاشان كليكى سەر ئەو وێنەيە دەكەين كە مەبەستمانە دواتر كليكى سەر Insert دەكەين دادەبەزێتە سەر لاپەڕەكە.






٣) From Scanner or Camera : دابەزاندنى وێنە لە كامێراوە يان سكانەرەوە، كە دەبێت لەم كاتەدا ئامێرى سكانەرەكە يان كامێراكەی پێوە بەسترابێت.

٤) Organization Chart : ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ دروست کردنی هێلکاری.

٥) Auto Shapes : لەم بەشەدا کۆمەڵێك شێوەی جۆراوجۆر هەیە کە دەتوانین هەریەکەیان بەکاربێنین بەپێی ویستی خۆمان.




دوای ئەوەی یەکێك لەو شێوانەی سەرەوە دیاری دەکەین ئەوا بەبێ دەست هەڵگرتن لەسەر کلیکی ماوسەکە شێوەکە دروست دەکەین لەسەر رووی لاپەڕەکە، و بە کلیك کردنی راست لەسەر شێوەی دروستکراو، لیستێك دەکرێتەوە، ئینجا کلیك لەسەر Add Text دەکەین بۆ ئەنجامدانی نووسینی مەبەست لە ناو شێوەی دانراو.

٦) Word Art : بەهۆی ئەم فەرمانە دەتوانین نووسینی هونەری بنووسین.

دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Word Art) بۆکسێك دەکرێتەوە کە تیایدا نووسینی مەبەست دیاری دەکەین وکلیك لەسەر (OK) دەکەین، دواتر ئەو نووسینەی کە دەمانەوێت دەینووسین وکلیك لەسەر (OK) دەکەین.



**تێبینی:**

لە کاتێکدا کە وێنەیەك یان نووسینێك کە بە (Word Art) ئەنجامدرا بێت بمانەوێت شوێنەکەی جێگیر بکەین یان گەورەو بچووکی بکەین ودەستکاری بکەین ئەوا لە رێگەی شریتی ئامرازی(Picture)ەوە دەتوانین ئەو کارە ئەنجام بدەین.




٧) Chart: بەهۆی ئەم فەرمانە دەتوانین هێلکاری دروست بکەین.

# شریتی ئامرازی وێنەكێشان

# Drawing Toolbar




١. ئەم بەشە پێك دێت لە كۆمەڵێك فەرمان كە بەهۆیەوە دەتوانین نوسین بخەینە پشت وێنەوە یان وێنە بخەینە پشت نووسینەوە یان وێنەو نوسین بسوڕێنین بەمەرجێك نووسینەكە بە Word Art نووسرابێت، وهەر لەم بەشەدا كۆمەڵێك شێوەی جۆراوجۆرو فەرمانی هەمەجۆرو هێڵی جۆراوجۆر هەیە كە دەتوانین بەكاریان بێنین.

٢. بۆ دیاری كردنی بەشێك یان شێوەیەك.

٣. پێكدێت لە كۆمەڵێك شێوەی جۆراوجۆر كە دەتوانین بەكاریان بێنین بەپێی ویستی خۆمان.

٤. بۆ دروستكردنی پارچە راستەهێڵ.

٥. بۆ دروستكردنی تیشك.

٦. بۆ دروستكردنی چوارگۆشەو لاكێشەی ئاسایی.

٧. بۆ دروستکردنی شێوەی هێلکەیی(بڕگەی ناتەواو) یان بازنەیی.

٨. بۆ دروستکردنی چوارگۆشەو لاکێشەی ئاسایی بەکاردێت و دەتوانین نووسین لەناویدا بەشێوەیەکی ئاسۆیی بنووسین، و دەتوانین(وێنە)ش لەناویدا دابنێین.

٩. بۆ دروستکردنی چوارگۆشەو لاکێشەی گۆشەوەستاو بەکاردێت ودەتوانین نووسین لەناویدا بنووسین بەشێوەیەکی ستونی، ودەتوانین(وێنە)ش لە ناویدا دابنێین.

١٠. بۆ نووسینی هونەری جۆراوجۆر بەکاردێت.

١١. بۆ دروستکردنی هێڵکاری ڕێکخراوەیی.

١٢. ئەم بەشە پێکدێت لە کۆمەڵێك وێنەی ئامادەکراوی جۆراوجۆر هەر وێنەیەکمان مەبەست بێت دەتوانین دایبەزێنینە سەر لاپەڕەکەوە

١٣. بۆ هێنانی وێنە بەکاردێت لەناو ( سی دی و فلاش دیسك)ەوە یان لەناو یەکێك لە درایڤەکانی کۆمپیوتەرەوە بۆ ناو ئەو فایلەی کاری تێدا دەکەین.

١٤. بۆ ڕەنگ کردنی بەشێکی دیاری کراوی داخراو.

١٥. بـــۆ ڕەنـــگ کردنـــی چوارچـــێوەی (چوارگۆشـــەو لاکێـــشەو بازنەو...هتد).

١٦. بۆ ڕەنگ کردنی پیتەکانی نووسینێك.

١٧. پێـك دێـت لەکۆمـەڵێك هێـڵ کـە دەتـوانین بـەهۆی ئـەم بەشـەوە شێوەی هێڵەکان بگۆڕێن لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر.

١٨. ئەم بەشە بەکاردێت بۆ گۆڕینی شێوەی هێڵەکان.

١٩. بـۆ گـۆڕینی شـــێوەی تیـشك بـەکاردێت لەشـێوەیەکەوە بـۆ شێوەیەکی تر.

٢٠. بـۆ دروسـتکردنی سـێبەر بـۆ نووسـین و وێنـە، بـەڵام دەبێـت نوسینەکە بە شێوەی هونەری نووسرابێت.



٢١. بـۆ دانـانی ســێ دووری بـۆ نووســین بـەکاردێت بـەڵام دەبێــت نووسینەکە بە نوسینی هونەری نووسرابێت.




ئەگەر بمانەوێت گۆڕانکاری لە سێ دووریەکەدا بکەین ئەوا کلیك لەســەر (3D-Settings) دەکـەین شـریتێکمان پیـشان دەدات کـە دەتوانین بەهۆی ئەم شریتەوە گۆڕانکاری لە سێدوریەکەدا بکـەین کـەمی بکـەین یـان زیادیبکـەین یـان بیـسوڕێنین یـان ڕەنگــی سێدوریەکە بگۆڕین لەشێوەکەوە بۆ شێوەیەکی تر.



# لیستی Format

## * Bullets and Numbering: دانانی ژمارە و هێما




کاتێك هەر نووسراوێك دەنووسین ئەوا زۆر جار خاڵی تێدەکەوێت کە یان بە ژمارە دایدەنێین یان بە دانانی هێمایەك بۆ سەر دێڕەکان بەپێی پێویستی نووسینەکە.

کاتێك بمانەوێت هێما دابنێین بۆ سەرەتای دێڕەکان ئەوا لە لیستی Format دا کلیك دەکەین لەسەر Bulletsand Numbering بۆکسێك دەکرێتەوە کە لە ناویدا هێمای مەبەست دیاری دەکەین وکلیك لەسەر OK دەکەین.



بەڵام ئەگەر بمانەوێت زنجیرەی ژمارە دابنێین بۆ سەرەتای هەموو دێرێك ئەوا دوای ئەوەی لە لیستی Format دا بەشی Bullets and Numbering مان دیاری کرد لە بەشی Numberedدا ئەو شێوە زنجیرەیە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێت لەدوایدا کلیك لەسەر OK دەکەین.




## * Borders and Shading: دانانی چوار چێوە بۆ لاپەڕە

بۆ دانانی چوارچێوەی لاپەڕەك سەرەتا لیستی Format دەکەینەوە، کلیکی سەر Borders and Shading دەکەین، لێرەدا بۆکسێك دەکرێتەوە، کلیك لەسەر بەشی Page Border دەکەین و لە Style دا چوارچێوەی مەبەست دیاری دەکەین. دواتر دەتوانین بۆ گۆڕانکاری لە ڕەنگی هێڵی چوارچێوە دیاری



کراوەکـەدا لـە Color دا دیـاری دەکـەین بـەو شـێوەیەی کـەخۆمان مەبەستمانە، و لە Width دا پانتایی هێڵی چوارچێوەکە دەگۆڕین، دواتـر کلیکـی سـەر OK دەکـەین دەبیـنین چوارچـێوە بـۆ لاپـەڕەی مەبەست دروست بووە.

## * Columns: دابەشکردنی پەڕە بەچەند ستونێك

کە لە لاپەڕەیەکدا دەنووسین دەبینین بەشێوەیەکی ئاسایی نوسینەکەمان تەنها لـە یـەك سـتوون پێکـدێت و بـۆ کردنـی بـە دوو ستون یان زیاتر لە لیـستی Format دا کلیکـی سـەر Columns دەکـەین کـە




ڕاستەوخۆ بۆکسێك دەکرێتەوە لـە Presets دا چـەند سـتوونێکی ئامادەکراوی تێدایـە دەتـوانین یـەکێکیان هەڵبـژێرین بـە پـێ ی مەبەست، وە لـە Number Of Columns دا دەتوانین ژمارەی

ستونەکان بنووسین کە چەند ستوون بێت، کاتێك کە بمانەوێت پانتایی ستوونێك لەستوونێکی تر زیاتر بێت یان کەمتر ئەوا بەهۆی بەشی (Width)ەوە دەتوانین پانتایی ستوونی مەبەست زیادو کەم بکەین.

ئەگەر بمانەوێت نێوانی ستونەکان جیاواز بن ئەوا لە (Spacing)ەوە ئەو کارە ئەنجام دەدەین.

پاش ئەوەی کە لاپەرەکە کرا بە دوو ستون یان زیاتر کە دەنووسین دەبینین نووسینەکە لە ستوونی چەپەوە دەست پێدەکات، بەڵام ئەگەر نووسینەکەمان کوردی یان عەرەبی بێت دەبێت لە راستەوە دەست پێ بکات لەم کاتەدا کلیکی سەر Right - to - left دەکەین، دەبینین نووسینەکە دەچێتەوە بۆ لای راست.

دەتوانین ستوونەکان زیاتر لێك جیابکەینەوە بەهۆی هێڵ خستنە نێوانیانەوە بە کلیك کردن لەسەر Line Between ، کە راستەوخۆ لەسەر بۆکسەکە لە بەشی Preview دەردەکەوێت.

دوای ئەوەی ئەو فەرمانانەی سەرەوە ئەنجامدرا کلیك لەسەر OK دەکەین.

## * :Change Case

ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ گۆڕینی پیتەکانی ئینگلیزی لە ( گەورە Capital )ەوە بۆ ( بچووك Small ) یان بە پێچەوانەوە.

پاش دیاركردنی رستەکە یان وشەکە یان پیتەکە لە لیستی Format كلیك لەسەر Change Case دەکەین، ئەم بۆکسە دەکرێتەوە کە بەم شێوەیە بەکاردێت:



- ❖ Sentence Case : بـــۆ گـــۆڕیـــنی یـــەکەم پیتی دەقە دیاری کراوەکە بە Capital.
- ❖ Lowercase : هـــەموو بەشـــە دیاریکراوەکـــە دەکـات بـــە Small.
- ❖ UPPERCASE: هـەموو بەشـە دیاریکراوەکـە دەکـات بـە Capital.
- ❖ Title Case: یەکـەم پیتی هەموو وشەیەك کە دیاریکراوە دەکات بە Capital.
- ❖ tOGGLE cASE : بـــەکاردێت بـــۆ پێچەوانە کـــردنەوەی Capital و Small ی وشەکان.

# لیستی Tools

## * Spelling and Grammar:




بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت هەڵەی ڕێنووسی و هەڵەی ڕێزمانی چاك بكەیت لە نووسینی ئینگلیزی دا.

ئەگەر وشەكە هەڵەی ڕێنووسی تێدابێت ئەوا یەك هێڵی سوور بە ژێریدا دێت ، بەڵام ئەگەر وشەكە هەڵەی ڕێزمانی تێدابێت ئەوا یەك هێڵی سەوز بە ژێریدا دێت.

وە بۆ چاككردنەوەی هەڵەی ڕێنووسی یان هەڵەی ڕێزمانی كلیكی ڕاست لەناو وشەكەدا بكەو كلیك لەسەر وشە ڕاستەكە بكە، یان وشەكە دیاریبكەو لە لیستی (Tools)دا كلیك لەسەر (Spelling and Grammar) بكە بۆكسێكت بۆ دەكرێتەوە لەناویدا وشە ڕاستەكە هەڵبژێرە، ئەگەر بتەوێت وشە وشە هەڵەكانت بۆ چاك بكاتەوە ئەوا كلیك لەسەر (Change) بكە ، بەڵام ئەگەر بتەوێت هەموو وشە هەڵەكانی ناو نووسینەكەت بە یەكجار بۆ بگۆڕێت ئەوا كلیك لەسەر (Change All) بكە.

وە ئەو هێڵە سوورە یان ئەو هێڵە سەوزەی كە بەژێر وشەكەدا دێت لەكاتی چاپكردندا دەرناكەوێت بەڵكو تەنها هێڵكی خەیاڵی یە.

# * Auto Correct Options:

بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت نووسین بەشێوەیەکی خێرا دابنێیتەوە لەناو هەر شوێنێکی لاپەڕەکانی فایلەکەدا کە مەبەستت بێت.

یەکەمجار لەناو لیستی Tools دا کلیك لەسەر فەرمانی Auto Correct Options بکە بۆکسێکت بۆ دەکرێتەوە کلیك لەسەر Auto Correct بکە و Plain Text دیاری بکەو لەبەشی Replace دا پیتێکی نووسینەکە بنووسە و لەبەشی With دا نووسینەکە بنووسەو کلیك لەسەر Add بکە لەدوایدا کلیك لەسەر OK بکە.



لە دواییدا لەناو لاپەڕەکەدا ئەو پیتە بنووسە کە لەبەشی Replace دا نووسیوتە لەپاشان دوگمەی Space یان Enter داگرە لە سەر کیبۆردەکە یەکسەر بەشێوەیەکی خێرا نووسینەکە دەنوسرێتەوە.

بۆ سڕینەوەی نووسین لە ناو Auto Correct Options دا نووسینەکە لە ناو Auto Correct Options دا دیاری بکەو کلیك لەسەر Delete بکە.

# لیستی Table

## * دروستکردنی خشته :




بۆ دروست کردنی خشته ئەم هەنگاوانە بەکاربهێنە:

١. کلیك لەسەر لیستی Table بکە.

٢. لە بەشی Insert دا Table دیاری بکە ئەم بۆکسە دەکرێتەوە:

٣. لە بەشی Number of Columns دا ژمارەی (ستوون)ەکانی خشتەکە بنووسە، و لەبەشی ( Number of Rows) دا ژمارەی (ریز)ەکانی خشتەکە بنووسە.



٤. لە بەشی Auto Format دا شێوەی خشتەکە دیاری بکە و کلیك لەسەر OK کە.




٥. دوای ئەوەی ئەو بەشانەی سەرەوەت دیاری کرد کلیك لەسەر OK بکە خشتەکە بەم شێوەیە دروست دەبێت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |

**تێبینی:**

١. Column: واتە (ستوون).

٢. Row: واتە (ریز).

٣. Cell: واتە (خانە).

# شریتی ئامرازی خشته و چێوه

# Tables and Borders




١. بەکاردێت بۆ دروستکردنی خشته به پێنووس .

٢. بەکاردێت بۆ سڕینەوەی هێڵ لەناو خشتەکەدا.

٣. بەکاردێت بۆ گۆڕینی شێوەی هێڵ.

٤. بەکاردێت بۆ گۆڕینی پانی هێڵ.

٥. بەکاردێت بۆ دیاریکردنی رەنگی هێڵەکە.

٦. بەکاردێت بۆ دانان و لابردنی هێڵ.

٧. بەکاردێت بۆ رەنگکردنی خانەیەك یان زیاتر.

٨. بەکاردێت بۆ دروستکردنی خشتەو زیادکردنی ستوون بۆ لای ڕاستو چەپی خشتەکەو زیادکردنی ریز بۆ ژێرەوەو سەرەوەی خشتەکە و کۆمەڵێك کاری تر.

٩. بەکاردێت بۆ تێکەڵکردنی دوو خانە یان زیاتر.

١٠. بەکاردێت بۆ دابەشکردنی خانەیەك بۆ چەند(ستوون و ریز)ێك.

١١. بەکاردێت بۆ ڕێکخستنی جێگای نووسینەکە لەناو خانەی مەبەستدا.

١٢. بەکاردێت بۆ بەرزی ریزەکان.
١٣. بەکاردێت بۆ پانی ستوونەکان.
١٤. بەکاردێت بۆ گۆڕینی ڕێکخستنی خشتەکە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر.
١٥. بەکاردێت بۆ گۆڕینی ئاڕاستەی نووسین لە ناو خانەی مەبەستدا.
١٦. بەکاردێت بۆ ریزکردنی (ژمارە) لە (بچووکترین) ژمارەوە بۆ (گەورەترین) ژمارە و ریزکردنی (ناو) لە (أ)ەوە بۆ (ی) لە زمانی کوردی وعەرەبی وە لە (A)ەوە بۆ (Z) لە زمانی ئینگلیزی.
١٧. بەکاردێت بۆ ریزکردنی (ژمارە) لە (گەورەترین) ژمارەوە بۆ (بچوکترین) ژمارە، و ریزکردنی (ناو) لە (ی)ەوە بۆ (أ) لە زمانی کوردیو عەرەبی و لە (Z)ەوە بۆ (A) لە زمانی ئینگلیزی.
١٨.بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی کرداری کۆکردنەوە لەناو خشتەکەدا.

# ڕاهێنـــــــان

## * لایەنی تیۆری:

**پ١)** پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:

(Symbol ،Replace ،Open ،Microsoft Word)

**پ٢)** ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەرەوە:

١. دوگمەی Caps Lock بەکاردێت بۆ..........

٢. بۆ نووسینی پیتی (ژ) لە زمانی کوردیدا پیتی ........ بەکاردەهێنین.

٣. فەرمانی Save بەکاردێت بۆ ...............

**پ٣)** باسی نووسینی زمانی (کوردی و عەرەبی) بکە؟

## * لایەنی پراکتیکی:

**پ١)** وەڵامی ئەم لقانەی خوارەوە بدەرەوە:

أ. فایلێك ئامادەبکە لاپەڕەکانی لەباری ستونی بێت، پەراوێزی لاکانی سەرەوەو خوارەوە و لایراستو لایچەپ ١سم بێت، دواتر لەناوی دا (ناوی سیانی خۆتوناوی خوێندنگەکەت) بنووسەو داببکە بەناوی (کوردستان)ەوە.

ب. لــه ســەرەوەی هــەموو لاپــەڕەکان بنووســرێت (هــەرێمی کوردستان)، و لـە خـوارەوەی هـەموو لاپـەڕەکان بنووسـرێت (وەزارەتی پەروەردە)؟

ج. وێنەیـەك دابەزێنـە نـاو لاپەڕەکـە؟ لـە دوایـدا زنجیرەی ژمـارە دابنێ بۆ لاپەڕەکان بکەوێتە ناوەڕاستی لاپەڕەکە لەخوارەوە؟

پ٢) ئەم خشتەیە دروست بکە بەم شێوەی لای‌خوارەوە لەدواییدا وانەکانی هەفتەی تێدا بنووسە؟

| شەمە | ١ شەمە | ٢ شەمە | ٣شەمە | ٤ شەمە | ٥ شەمە |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

***************************************

# بەشی دووەم

# ئینتەرنێت Internet

## پێشەکی مێژوویی:

ئینتەرنێت زاراوەیەکی لێکدراوە لە هەردوو وشەی (ئینتەر) لەگەڵ (نێت) دا، کە یەکەمیان بەمانای (جیهانی) دێت و دووەمیشیان بەمانای (تۆڕ) دێت، واتە (تۆڕی جیهانی).

باشترین پێناسە بۆ ئینتەرنێت ئەوەیە کە تۆڕێکی فراوانی کۆمپیوتەرییە لە سەرانسەری جیهاندا کە چەندەها کۆمپیوتەری لەهەموو لایەکی جیهاندا پێکەوە بەستۆتەوەو بەکارهێنەر دەتوانێت لەهەریەك لەو کۆمپیوتەرانەو بە ئاسانی بگاتە ئەوانی تر و زانیاری لێ وەربگرێت.

مێژووی دروستبوونی ئینتەرنێت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵەی کە زانا (پۆل باران) دای لە ساڵی ١٩٦٤ دا، و هەروەها زۆر لە سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە سەرەتای دروست بوونی ئینتەرنێت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تۆڕە گەورەیەی کە لەساڵی (١٩٦٩)دا دامەزرا، کاتێك (وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا) هەستا بە دروستکردنی پرۆژەیەك کە لە ڕێگەی هێڵی تەلەفۆنەوە بتوانرێت زانیاری ئاڵوگۆڕ بکرێت لەنێوان (وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا)و

ناوەندەکانی توێژینەوەی زانستی لە جیهاندا، وە یەکەم ناوەندی توێژینەوە لە شاری لۆس ئەنجلیس لە زانکۆی (کالیفۆرنیا) بەناوی (Arpanet)ەوە دامەزرا.

تۆڕی ئینتەرنێت لەساڵی ۱۹۷۳دا گەشەی پێدراو وای لێکرا بتوانێت بەئاسانی لە نێوان بەشدارەکانیدا زانیاریەکان ئاڵوگۆڕ بکات، پاشان چەند لایەنێکی تر هاتنە ناو پرۆژەکەوەو فراوانتریان کرد لەوانەش زانکۆی لەندەن لە ئینگلتەرا و دەزگای راداری نەرویجی، بە بەشداری کردنی ئەلمان پرۆژەیەکی نوێیان پێکهێنا کە ناونرا بە (پرۆژەی پێکەوەبەستنی تۆڕەکان).. و ئەو تۆڕەی لەم پرۆژەیە هاتە کایەوە ناونرا بە ئینتەرنێت (Internet).

سیستەمی پەیوەندی کردن لە هێڵی ئینتەرنێتدا لە ساڵی(۱۹۸٦)ەوە گەشەی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی کاتێك دەزگای نیشتمانی ئەمریکی بۆ زانستەکان لە وڵاتە یەگرتووەکانی ئەمەریکا چەند رێگەیەکی نوێ و خێرای هێنایە کایەوە بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان لە نێوان کۆمپیوتەرەکانی بەشداربووی تۆڕی ئینتەرنێت... هەروەها بە دانانی پرۆتۆکۆلەکانی چاودێری گواستنەوە و پرۆتۆکۆلەکانی ئینتەرنێت لەساڵی ۱۹۹۰ کە بە (TCP/IP) واتە (Transmission Control protocol /Internet protocol) ناسرا.

ئەوەی لێرەدا جێگای ئاماژە بۆ کردنە ئەوەیە کە ژمارەی بەشداربووانی ئینتەرنێت لە ساڵی ١٩٨٢ دا نەدەگەیشتە هەزار کەس.. لە ساڵی ١٩٩٠ دا ئەو ژمارەیە گەیشتە ٧٠٠ هەزار کەس کە دابەشبوون بە سەر ٣٦ وڵاتی سەر رووی زەویدا.. و ئێستا لە ملیۆنەها بەشداربووی سەر رووی زەوی پێك دێت..

ئەم فراوانبوونە خێرایەی ئینتەرنێت گرنگی و بایەخی ئەم زانستە دەردەخەن و رادەی پێویستی بۆ ئێستای ئێمەی گەلی کورد زیاتر دەکەن کە لە هەنگاونانماندا بەرەو پێشکەوتن و بنیاتنانەوەی وڵاتەکەمان سوودی زۆر لەم تەکنەلۆجیایە وەربگرین..

# بەکارهێنانەکانی ئینتەرنێت

لەسەرەتادا رەنگە ئەو پرسیارە بە بیری هەمووماندا بێت کە ئایا دەبێت بەکارهێنانەکانی ئینتەرنێت لە ژیانی رۆژانەدا لە کوێدا بێت و سوودەکانی چی بن.. ئێمە لێرەدا دەمانەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوەو بەکارهێنەرەکانی ئینتەرنێت لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوەکە ئەمانەن وپاشان یەکە بە یەکە باسیان دەکەین.

١- سەیرکردنی لاپەڕەکانی ئینتەرنێت لە رێگەی (سایت)ەوە، کە خوێندنەوەی بابەت و زانیاری دەگرێتەوە.

٢- گەڕان بەدوای زانیارییەکاندا .

٣- ناردن و وەرگرتنی نامەی ئەلیکترۆنی .

٤- گفتوگۆکردنی راستەوخۆ.

ئەمە جگە لە چەندین سوودی گەورەی تر وەك بازرگانی ئەلیکترۆنی و کڕین و فرۆشتن و چەندین خزمەتگوزاری تر.

لێرەدا هەوڵدەدەین باسی یەکێك لەو چوار خزمەت گوزارییە گرنگەی ئینتەرنێت بکەین بە شێوەیەك کە قوتابی بتوانێت بە ئاسانی سوودیان لێ وەربگرێت..

**سایت Site:** مەبەست لەو شوێنەیە لە ئینتەرنێتدا کە کۆمپانیایەك یاخود دەزگایەك یاخود کەسێك دروستی کردووە بە چەندەها لاپەڕە لە زانیاری هەمەجۆر دەگرێتە خۆی و ناونیشانێکی تایبەتی هەیەو هەموو کەسێك لە هەموو لایەکی جیهاندا دەتوانن سەردانی بکەن و سوودی لێ وەربگرن.

**تێبینی:**

هێمای (www) لەم سێ وشە وەرگیراوە(World Wide Web) واتە (تۆڕی جیهانی).

# کردنەوەی ئینتەرنێت

## بۆ کردنەوەی ئینتەرنێت ئەم هەنگاوانە بەکاردەهێنین:

١. کلیك لەسەر Start دەکەین.

٢. نیشاندەر دەخەینە سەر Programs یان All Programs.
لیستێك دەردەکەوێت

٣. لە لیستەکە کلیك لەسەر Internet Explorer دەکەین.

یان لەسەر (Desktop) دوو کلیك لەسەر ئایکۆنی ئینتەرنێت دەکەین.




لەپاش کەمێك چاوەڕوانی ئەوا ویندۆی تایبەت بە ئینتەرنێت دەکرێتەوە کە جگە لە شریتی ئامرازە گشتییەکان شریتێکی ئامرازی تایبەت بە نووسینی ناونیشانی پێکەی (سایتی) تیدایە کە پێی دەوترێت Address .




پاش چوونە ناو تۆڕی ئینتەرنێت لە Addressدا دەتوانیت ناوی ئەو سایتەی کە مەبەستە بینووسیت:




پاش ئەوەی کە ناوی سایتەکەت نووسی کلیك لەسەر Go بکە یان Enter لەسەر کیبۆردەکە و سایتەکەت بۆ دەکرێتەوە..

## شریتی ئامرازی پیوانەیی Standard Toolbar




Back: بۆ گەرانەوە بۆ لاپەرەی دواوە.

Forward: بۆ چوون بۆ لاپەڕەی پێشەوە.

Stop: بۆ وەستاندن.

Refresh: بۆ گەڕانەوە بۆ لاپەرەی سەرەکی.

Search: بۆ گەڕان.

Favorites: لیستی ئەو پێگنەی زۆر بەکار دەهێنرێن.

Media : تایبەت بەو فایلانەی کە بە (Media player) دەکرێتەوە.

History: بۆ پیشاندانی ئەو پێگانەی کە لە رابردوودا کراونەتەوە.

Print: چاپ کردن.

Messenger : بۆ گفتو گۆکردن.

بەم شێوەیە و پاش کردنەوەی هەر پێگەیێك (سایتێك) و بە بەکارهێنانی ئەو ئایکۆنانەی سەرەوە دەتوانیت لەو سایتە سوود وەربگریت کە مەبەستەو لەناو لاپەڕەکانیدا بە ئاسانی هاتووچۆ

بکـەیت وە دەتوانیـت هـەر لاپەڕەیـەکی بـە پێویـستت زانـی چـاپی بکەیت یا خود لە ناو کۆمپیوتەر زەخیرە بکەی.

جێگای ئاماژەیە کە کۆتـایی ناونیـشانی هـەر سـایتێك کـورت کراوەیـــەك لـــەخۆ دەگرێـــت وەك (com، org، net،....هتـــد) کـــە هەریەکـە لەمانــە مانــای تایبــەتی خــۆی هەیــە وەك ئــەوەی لــەم خشتەیەدا روونکراوەتەوە:

## هەندێك هێمای تایبەت بە ئینتەرنێت

| هێما | ناوی هێما | کارەکەی |
|---|---|---|
| com | Commercial | تایبەتە بە کۆمپانیای بازرگانی |
| edu | Education | تایبەتە بە بواری پەروەردە |
| net | Network | تایبەتە بە تۆڕی خزمەتگوزاری |
| gov | Government | تایبەتە بە شوێنە حکومییەکان |
| mil | Militant | تایبەتە بە شوێنە سەربازییەکان |
| tv | Television | تایبەتە بە کەناڵە تەلەفیزۆنییەکان |
| org | Organization | تایبەتە بە ڕێکخراوە تایبەتەکان و ناحکومییەکان |

# پێگه (سایته) کوردیەکان

لێرەدا وەك نمونە بۆ سوود وەرگرتن چەند سایتێکی کوردی دەخەینە پێش چاوی خوێندکارانی ئازیز تا بتوانن سوودیان لێوەرگرن..ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە کورد وەك هەموو نەتەوەکانی تر توانیویەتی جێگای خۆی بکاتەوە لە ناو جیهانی ئینتەرنێت وە ئەم سایتانە نموونەیەکی زۆر بچووکی شارەزاکانی کوردە لەم بوارە زانستیە گرنگە، ئەمەش ناونیشانی کۆمەڵێك سایتی کوردین:

| | |
|---|---|
| www.krg.org | حکومەتی هەرێمی کوردستان |
| www.moe-krg.org | وەزارەتی پەروەردەی هەرێم |
| www.Zkurd.org | زانستپەروەرانی کورد |
| www.hawlati.com | رۆژنامەی هاوڵاتی |
| www.awene.com | رۆژنامەی ئاوێنە |
| www.voa.gov/kurdish | دەنگی ئەمەریکا کوردی |
| www.kurdwomen.net | تایبەت بەژنی کورد |
| www.kurdistannet.org | کوردستان نێت |

# چۆنیەتی داکردنی وێنە لە ئینتەرنێتدا

زۆر جار وا پێویست دەکات لەناو تۆڕی ئینتەرنێت وێنەیەکت مەبەستە دایبکەیت یان چاپی بکەیت کە وێنەکە بەتەنها نیە بەڵکو لەگەڵ نووسیندایە، وئێمەش تەنها وێنەکەمان پێویستە لەناو ئینتەرنێتدا وێنە بەدوو رێگە دادەکرێت بەم شێوەیە:

## رێگەی یەکەم:



کاتێک نیشاندەرەکە لەسەر وێنەکە دادەنێین لەسەرەوەی لای چەپی وێنەکە چوار ئایکۆن دەردەکەوێت یەکەمیان وێنەی پەپکێکی نەرم پیشان دەدات بەکلیك کردنی دایدەکەیت لە هەر درایڤێکی کۆمپیوتەرەکەت بێت.

وێنەی دووەم وێنەی ئامێری چاپکردنە (Print) کە بەکلیك کردنی وێنەکە چاپ دەبێت.

وێنەی سێیەم وێنەی نامەیەکی تێدایە کە دەتوانرێت ببینرێت بۆئیمەیڵەکەت، ئەگەر ویستت بینێریت بۆ ئەو کەسەی کە مەبەستە.

وێنەی چوارەم وێنەی فۆلدەرێکە کە دەتوانیت دایبکەیت لەناو ئەوفۆلدەرەی کە تایبەتە بەوێنە.

### ڕێگەی دووەم :

کلیکی لای ڕاستی دەکەین لەسەر وێنەی مەبەست، لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە کە پێك هاتووە لەم فەرمانانە:




Save Picture As: بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین وێنەی مەبەست زەخیرە بکەین لە هەر درایڤێکی کۆمپیوتەرەدا کە.

E-mail Picture: بەکلیك کردنی دەتوانین وێنەکە بنێرین بۆ ناو ئیمەیلی مەبەست.

Print Picture: بەکاردێت بۆ چاپ کردنی وێنەکە .

Go to My Pictures: ناردنی وێنەکە بۆ ناو فۆڵدەری My Pictures

Set as Background: بەکلیك کردنی وێنەکە دەبێتە باکگراوندی کۆمپیوتەرەکەت.

Set as DesktopItem: بەکاردێت بۆ بردنی وێنەکە بۆسەر دیسك تۆپ.

Copy: بۆ لەبەرگرتنەوەی وێنەکە.

Add to favorites: بۆ ناردنی وێنەکە بۆ لیستە بەکارهاتووەکان.

# گەڕان لە ئینتەرنێتدا Search

بەکارهێنانی دووەمی ئینتەرنێت بریتیە لە کرداری گەڕان (Search) کە وادەکات زۆر بە ئاسانی و لە کاتێکی کەمدا سوودی زۆر لە زانیارییەکانی ناو ئەو تۆڕە وەربگریت، چونکە ئینتەرنێت گەلێك زانیاری بە سوودی تێدایە کە ئەوەندە زۆرن ئەگەر ئەم کردارە نەبوایە ئەوا نەمان دەتوانی وەك پێویست سوودیان لێ وەربگرین.

بۆ کرداری گەڕان زۆر سایتی گرنگ هەن لەوانە:

١) www. google.com

٢) www.ask.com

٣) www.yahoo.com

٤) www.altavista.com

٥) www.msn.com






بـەڵام گـرنگترین و بـەربڵاوترین سـایتی تایبـەت بـە گـەڕان بریتییە لە سایتی گۆگڵ www.google.com.

ئامانجی گۆگڵ پێشکەش کردنی باشترین خزمەت گوزارییـە و گۆگڵ بە خێراترین سایتی گەڕان دەژمێردرێت کە لەماوەیـەکی زۆر کەمدا ئەنجامی گەڕانەکـەت پێش کـەش دەکـات کـە ڕۆژانـە چـەندەها کەس سەردانی ئەم سایتە بە ناوبەنگە دەکەن.

بیرۆکـەی دروسـت بـوونی ئـەم سـایتە دەگەڕێتـەوە بـۆ دوو خوێنـدکاری دکتـۆرا (لاری بـایج و سـیرغی بـرین) لـە زانکـۆی (سـتافوێرد) کـە بـە بـڕی ٢٥ ملیـۆن دۆلار ئـەو کۆمپانیایـەیان دامەزراند کە لەلایەن سێ کۆمپانیاوە پارەکەی بۆ تەرخان کرا.

ئامانجی ئەم سایتە پێشکەش کردنی باشترین خزمەتگوزاری گەڕانە Search لە ناو ئینتەرنێتدا گۆگڵ لـە گـەڕان پشت دەبەستێت بەشێوازی گەڕانی ئۆتۆماتیکی ئاڵۆز کە شێوازێکی بابەتیانەی هەیـە لە دۆزینەوە.

## گەڕان لەناو سایتی گۆگڵ بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت:

کاتێــک دەتــەوێت دەربــارەی بابــەتێك لــە ئینتەرنێتــدا بخوێنیتەوە یان بەدوایدا بگەڕێیت، ئەوا نوسینی مەبەست لەناو ئەو بۆشاییەی بۆ ئەم مەبەستە دیاری کراوە بنووسە وکلیك لـەســەر (Google Search)بــکە، پــاش کــەمێك چاوەڕوانی دەبینیت گۆگڵ ژمارەیەکی زۆر ناونیشانی سایتی دیکەت بۆ دەهێنێت کە تیایدا مەبەســتەکەی تـۆی دیــاری کــردووەو بــە کلیــك کــردن لەســەری سایتەکەت بۆ دەکاتەوە.

ستافی گۆگڵ لە ( ٦ ) ئەنـدامی سـەرەکی پێـك هـاتووە و یەکێك لەو شەش ئەندامە کوردە ناوی ( ئومێد )ە .

گەڕان لە ناو سایتی گۆگڵ بە (١٠١) زمان هەیە ویەکێك لەو زمانانــە زمــانی (کــوردی)ە کــە تــازە دامــەزراوە و بــۆت هەیــە بــە ئارەزووی خۆت یەکێك لە زمانەکان هەڵبژێریت.

بۆ گۆڕینی زمانی بەکارهاتوو کـلیك لـــەســـەر Language Tools دەکـەین کە لاپەڕەیـەکمان پیشان دەدات کـە پێك هـاتووە لـە (١٠١) زمان.

**نموونـــــه**: ئەگـەر ویـستت ئـەو گەڕانـە بـەزمانی عـەرەبی بێـت کلیـك لەسەرArabic دەكەیت گۆگڵ دەگۆڕێتە سەر زمانی عەرەبی.

### Use the Google Interface in Your Language

Set the Google homepage, messages, and buttons to display in your selected language via our Preferences page. Google currently offers the following interface languages:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Afrikaans | English | Irish | Occitan | Swedish |
| Albanian | Esperanto | Italian | Oriya | Tamil |
| Amharic | Estonian | Japanese | Persian | Telugu |
| Arabic | Faroese | Javanese | Pig Latin | Thai |
| Azerbaijani | Filipino | Kannada | Polish | Tigrinya |
| Basque | Finnish | Klingon | Portuguese (Brazil) | Turkish |
| Belarusian | French | Korean | Portuguese (Portugal) | Turkmen |
| Bengali | Frisian | Kurdish | Punjabi | Twi |
| Bihari | Galician | Kyrgyz | Romanian | Uighur |
| Bork, bork, bork! | Georgian | Latin | Russian | Ukrainian |
| Bosnian | German | Latvian | Scots Gaelic | Urdu |
| Breton | Greek | Lithuanian | Serbian | Uzbek |
| Bulgarian | Guarani | Macedonian | Serbo-Croatian | Vietnamese |

یان لە ڕێگەی ئاڵای ئەو وڵاتەی کە مەبەستمانە کلیکی لەسەر دەکەین ئـەوا زمانەکـە دەبێتـە زمـانی ئـەو وڵاتـەی کـە کلیکمـان لەسـەر ئاڵاکەی کردووە.



# دروست کردنی ئیمەیڵ E-Mail

گرنگترین بەکارهێنانی سێیەمی ئینتەرنێت بریتییە لە پۆستی ئەلیکترۆنی E-Mail.

پۆستی ئەلیکترۆنی بەکاردێت بۆ ناردن و وەرگرتنی نامە و نوسراو و وێنە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە بەهۆی ئیمەیلێکی تایبەتەوە کە بەهۆی یەکێك لە سایتەکانەوە دروستی دەکەیت.

دەتوانیت لە زۆربەی سایتەکاندا ناونیشانی ئەلیکترۆنی دروست بکەیت کە زۆربەی زۆری سایتەکان لە دروست کردنی ئیمەیڵدا لە یەکەوە نزیکن وسایتی( Yahoo ) و ( Hotmail ) لە سایتە بە ناو بانگەکانی جیهان دەژمێردرێن کە زۆرترین ناونیشانی ئەلیکترۆنیان لەسەر دروستکراوەو باشترین و بەهێزترین سایتی خزمەتگوزارین لێرەدا سایتی Yahoo دەهێنینەوە بەنموونە.

بەم شێوەیە دەتوانیت لە سایتی (Yahoo)دا ببیتە خاوەنی پۆستی ئەلکترۆنی:

دوای ئەوەی چویتە ناو ئینتەرنێت و سایتی www.yahoo.com کردەوە وەك لە وێنەی یەکەمی خوارەوە دیارە، پاشان کلیك لەسەر Mail بکە بۆکسێکت پیشان دەدات وەك لە وێنەی دووەم:




To access Yahoo! Mail...

**Sign in to Yahoo!**

Yahoo! ID:

Password:

☐ Remember my ID on this computer

Sign In

Why this is secure

Forget your ID or password?
Sign-in help

---

**Don't have a Yahoo! ID?**

Signing up is easy.

**Sign Up**

كليك بكە لەسەر Sing Up فۆرمێك پیشان دەدات بەم شێوەیە:

**Create Your Yahoo! ID**

* First name:
* Last name:
* Preferred content: Yahoo! U.S.
* Gender: [Select]
* Yahoo! ID: @yahoo.com
ID may consist of a-z, 0-9, underscores, and a single dot (.)
* Password:
Six characters or more; capitalization matters!
* Re-type password:

**If You Forget Your Password...**

* Security question: [Select a Question]
* Your answer:
Four characters or more. Make sure your answer is memorable for you but hard for others to guess!
* Birthday: [Select a Month] dd , yyyy

* ZIP/Postal code:
Alternate Email:

**Customizing Yahoo!**

Industry: [Select Industry]
Title: [Select a Title]
Specialization: [Select a Specialization]

**Verify Your Registration**

* Enter the code shown: More info
This helps Yahoo! prevent automated registrations.

که داوای کۆمەڵێك زانیاریت لێ دەکات کە بەم شێوە فۆرمەکە پڕ بکەرەوە:

١. لە خانەی First Name دا ناوی یەکەمی خۆت بنووسە.

٢. لە خانەی Last Name دا ناوی باوکت بنووسە.

٣. لە بەشی Preferred Content دا وڵاتێك بە ویستی خۆت دیاری بکە بۆ نموونە لێرەدا Yahoo! US دیاری بکە.

٤. لە خانەی Gender دا رەگەزی خۆت دیاری بکە ئەگەر (کوڕ) بویت ئەوا Male وە ئەگەر (کچ) بویت ئەوا Female هەڵبژێرە.

٥. لە خانەی Yahoo ID دا نـــاوێك بـــنووسە کە ئەو ناوە دەبێتە ناونیشانی نامە ئەلکترۆنیەکەت.

دەتوانیت ناوی یەکەم ودووەم یان ناوی خۆت وژمارەیەك بنووسیت، یان هەر ناوێکی تر بێت بە مەرجێك ئەو ناوە پێش تۆ کەسێکی تر نەیبێت لەناو yahoo دا.

٦. لە بەشی Password دا وشەی نهێنی بنووسە کە لێرە دەتوانیت ژمارە بێت یان وشە بێت یان هەردووکیان بێت، دەبێت لە شەش پیت کەمتر نەبێت.

٧. دووبارە نووسینی وشەی نهێنی لە بەشی Re-type Password بە هەمان شێوەی سەرەوە.

٨. لە خانەی Security Question دا کـــۆمەڵێك پرسیاری بۆ ئامادە کردویت بە ویستی خۆت یەکێك لەو پرسیارانە هەڵبژێرە.

٩. له خانەی Your Answer دا وەڵامی پرسیارەکە بدەرەوە.

١٠. لـە خانـەی Birthday دا ڕۆژ ومـانگ وسـاڵ لـە دایـك بوونـت بنووسە.

١١. لـە خانـەی Current Email(Optional) دەتوانیـت بـە ویـستی خۆت ئیمەیلێکی دروستکراو بنووسیت بەڵام لەم خانەیـەدا بـە ئارەزووی خۆتە دەتوانیت وەڵامی نەدەیتەوە.

١٢. لــە خانــەی ZIP/Postal Code دا کـۆدی هـەر وڵاتێـك بێـت بینووسـە بۆ نموونـە کۆدی ئەمـەریکا ( ٩٢٠٢٥ )ە بینووسـە، و هەر وڵاتێك کۆدی تایبەتی خۆی هەیە.

١٣. وە لـە خانـەی Industry یـەکێك لـەو کارانـە هەڵبـژێرە کـە بـۆی دیاری کردویت.

١٤. لـە خانـەی Title دا کلیـك لـە یـەکێك لـەو کارانـە بکـە کـە بـۆی داناویت.

١٥. لە خانـەی Enter the Code Shown دا ئـەو نووسـینە بنووسـە کە بۆت دانراوە.

١٧. پاشان کلیك لەسەر I Agree بکەو کەمێك چاوەڕوان بە، ئەگـەر ئەو زانیاریانە کە لە فۆرمەکەدا نووسیت هەڵـەی تێدا بوو یـان لەلایـەن یـەکێکی تـر تۆمـارکرا بـوو ئـەوا پێـت رادەگـەینێت و هەڵەکەت بۆ دیاری دەکات تۆش هەڵەکە راست بکەرەوە.

بەڵام ئەگەر فۆرمەکە هەڵەی تێدا نەبوو یان لەلایەن یەکێکی تر ئەو ناونیشانە تۆمار نەکرابوو ئەوا سایتی Yahoo بەخێر هاتنت دەکاتو پیرۆزبایت لێ دەکات کەبوویت بە خاوەنی پۆستێکی نامەی ئەلیکترۆنی.

١٨. پاشان کلیك لەسەر Continue to Yahoo Mail بکە بۆ چوونە ناو ئیمەیڵەکەت ویەکەم جار نامەیەکت لەلایەن کۆمپانیای Yahoo بۆ ڕەوانە دەکرێت کە بەخێر هاتنت دەکات.

بەم شێوە بوویت بەخاوەنی پۆستی ئەلیکترۆنی.

# چۆنیەتی کردنەوەو ناردنی نامەی ئەلیکترۆنی (ئیمەیل)

## ١) کردنەوەی نامە :

سەرەتا لەناو سایتی Yahoo دا کلیك لەسەر Mail بکە بەم شێوەیە:




ئەم بۆکسەت بۆ دەکرێتەوە کە لەبەشی Yahoo! ID دا نووسینی پێش (@)ی ئیمەیلەکەت بنووسە.
لەپاشان لەبەشی Password دا وشەی نهێنی ئیمەیلەکەت بنووسە و کلیك لەسەر Sing In بکە یان دەست بنێ بە دوگمەی Enter دا لەسەر کیبۆردەکە.

To access Yahoo! Mail...
**Sign in to Yahoo!**

Yahoo! ID:

Password:

☐ Remember my ID on this computer

Sign In

Why this is secure

Forget your ID or password?
Sign-in help

**Don't have a Yahoo! ID?**
Signing up is easy.

Sign Up

لەدوایدا ئەم بۆکسەت بۆ دەکرێتەوە:




ئەگەر بتەوێ ئەو نامانە بکەیتەوە کە بۆت هاتووە یان داکراوە لەناو ئیمەیلەکەتدا، ئەوا کلیك بکە لەسەر Inbox ، پاشان کلیك بکە لەسەر Subject ی ئەو نامەیەی کە دەتەوێت بیکەیتەوە.

بەڵام ئەگەر بتەوێت هەر نامەیەك بسڕیتەوە کە مەبەستە ئەوا نامەکە دیاری بکەو کلیك لەسەر Delete بکە.

## زاراوەکان

**Sender**: لەم بەشەدا ناونیشانی ئەو ئیمەیلە دەنووسرێت کە بۆت هاتووە.

**Subject** : لەم بەشەدا ناوی بابەتی نامەکە دەنووسرێت کە بۆت هاتووە.

**Date**: لەم بەشەدا بەرواری ناردنی نامەکە دەنووسرێت کە بۆت هاتووە.

**Size**: لەم بەشەدا قەبارەی نامەکە دەنووسرێت.

**Inbox**: ئەم بەشە وەك صندوقێك وایە ئەو نامانەی تێدایە کە بۆت هاتوون یان داکراون.

## ٢) ناردنی نامە (ئیمەیڵ) :




بۆ ناردنی ئیمەیل کلیك لەسەر Compose بکە بۆکسێکت بۆ دەکاتەوە کە لەخانەی To دا ئیمەیلی ئەو کەسە بنووسە کە ئیمەیلەکەی بۆ دەنێریت و بەهۆی فەرمانی Add cc یان Add BCC دەتوانی هەمان نامە بۆ کەسی تریش بنێریت، و لەبەشی Subject دا بابەتی ئیمەیلەکە بنووسە.

لە دواییدا ئەو نووسینە بنووسە کە مەبەستە پاش ئەوەی نووسینەکەت نووسی کلیك لەسەر Send بکە.



ئەگەر نامەکە نێردرا ئەوا پێت رادەگەیەنێت کە نامەکە نێردرا دەنوسرێ Message Sent واتە نامەکە ڕۆیشت، بەڵام ئەگەر هاتوو نامەکە نەنێردرا ئەوا پێت ئەڵێت نامەکە نەڕۆیشت ئەویش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەی نووسینی ئیمەیلەکە.

وە ئەگەر ویستت ئەو ئیمەیلەی کە نامەکەت بۆ ناردووە دایبکەیت لەناو Address Book دا ئەوا کلیك لەسەر Add to Address Book بکە ئەوا بەم شێوە ئیمەیڵی مەبەستت بۆ دادەکرێت لەناو Address Book دا.

# چۆنیەتی ناردنی هاوپێچ لەگەڵ نامەدا




لەکاتێکدا وا پێویست دەکات لەگەڵ نامەکەدا وێنەیەك یان هەر هاوپێچێك بنێریت لێرە پێویستە کلیك لەسەر Attach File بکەیت و پاشان بۆکسێکی ترت بۆ دەکرێتەوە کلیك لەسەر Browse بکە:




پاشان بۆکسێکت پیشان دەدات ئەو درایڤە یان ئەو فۆڵدەرە دیاری بکە کە وێنەکە یان هاوپێچەکەی تێدایە، لەدوایدا وێنەکە یان هاوپێچەکە دیاری بکەو کلیك لەسەر (Open) بکە بەم شێوەیە:




لە دوایدا جارێکی تر کلیك لەسەر Attach File بکە پاش کەمێك چاوەڕوانی بکە هەتا وەکو وێنەکە یان هاوپێچەکە دادەبەزێت.

پاشان کلیك لەسەر Continue to Message بکە و کلیك لەسەر Send بکە .

# ناردنی كارت لەگەڵ نامەدا (ئیمەیلدا)

YAHOO! Greetings

زۆرجار لەكاتی نامە نووسیندا وا پێویست دەكات كە لەگەڵ نامەكەدا كارتێك بۆ هاوڕێكەت ڕەوانە بكەیت بۆ ئەم مەبەستە سایتی yahoo كۆمەڵێك كارتی ئامادەكراو تێدایە، هەموو بۆنەیەك




كارتی تایبەتی خۆی هەیە، زۆربەی كارتەكان مۆسیقایان لەگەڵ دایە بەم شێوەیە دەتوانیت كارت ڕەوانە بكەیت بۆ هاوڕێكەت، سەرەتا بڕۆ ناو ئیمەیڵەكەتەوە پاشان كلیك لەسەر Compose بكە بۆكسێكی ترت پیشان دەدات كەلای ڕاستی بۆكسەكە نووسراوە Send an eCard واتە ناردنی كارت پاش ئەوەی كە كلیكت كرد لەسەر Send an eCard دەچیتە ناو yahoo Greetings كە هەمووجۆرە كارتێكی تێدایە كە تایبەتن بە هەموو بۆنەیەك و بۆ هەر بۆنەیەك كۆمەڵێك كارتی بۆ ئامادە كردوویت، بۆ نموونە كلیك بكە

لەسەر thank you بکە کۆمەڵێك کاری تایبەتت بە سوپاس کردن




پیشان دەدات کە بە ئارەزووی خۆت کلیك لە یەکێك لەو کارتانە بکە پاش ئەوەی کە وێنەکەت هەڵبژارد لەدوایدا کلیك بکە لەسەر ئەو وێنەی کە دیاریت کردووە پاشان وێنەکەت پیشان دەدات و کلیکی راستی ماوسەکە لەسەر وێنەکە بکەو فەرمانی (Save Picture As) دیاری بکەو وێنەکە دابکە لە درایڤێکدا یان لە فۆڵدەرێکی مەبەستدا لە کۆمپیوتەرەکەدا بە ناوێکەوە.






لەدواییدا بڕۆ ناو ئیمەیلەکەی خۆتەوە بەهۆی فەرمانی ( Attach Files)ەوە وێنەی مەبەست بنێرە.

# چۆنیەتی گۆڕینی وشەی نهێنی

# Change password

زۆرجار وا پێویست دەکات کە وشەی نهێنی ئیمەیلەکەت (Password) بگۆڕیت ئایا لەبەر ئاشکرابوونی وشەی نهێنی ئیمەیلەکەت یان لەبەر هەرهۆیەك بێت دەتوانیت بەم شێوەیە وشەی نهێنی ئیمەیلەکەت بگۆڕیت:

١) سەرەتا ئیمێلەکەت بکەرەوە.

٢) کلیك لەسەر(Option) بکە.

٣) پاشان کلیك لەسەرAccount Information بکە بەم شێوەیە:




پاشان بۆكسێكى ترت پيشان دەدات لە بۆشايى Password دا وشەى نهێنيە كۆنەكەت بنووسەو پاشان كليك لەسەر Sign In بكە.

To access Yahoo! Mail...
**Please verify your password**
Yahoo! ID: **sharabakr**
Password:
Sign In
Why this is secure
Forget your ID or password?
Sign-in help

Not sharabakr?
Sign in as a different user.

٤) فۆرمێكى تر دەبێتەوە تێيدا كليك لەسەر Change password بكە.

٥) بۆكسێكى تر دەبێتەوە كە لە سىَ بۆشايى پێك هاتووە:

Enter your **Current Password:**

Choose a **New Password:**

Confirm your **New Password:**

Save Cancel

أ. لە بۆشایی یەکەمدا Enter your Current Password وشەی نهێنییە کۆنەکەت بنووسە.

ب. لـــە بۆشـــایی دووەمدا Choose New Password وشـــە نهێنییە تازەکەت بنووسە.

ج. لـە بۆشایی سـێیەمدا Confirms your New Password دووبارە ووشەی نهێنییە تازەکەت بنووسەرەوە.

پاشـان کلیـك لەسـەر Save بکـە لەدواییـدا پێـت ڕادەگـەیێنێت کـە گۆڕینی وشەی نهێنی ئیمەیلەکەت بەسەرکەوتویی کۆتای هات.

**Yahoo! Password Changed**

**You have successfully chosen a new Password.**

Return to Yahoo!

## گفتوگۆ کردن Chat

یەکێکی تر لە سوود وبەکارهێنانەکانی ئینتەرنێت بریتیە لە کرداری گفتوگۆ کردنی راستەوخۆ کە دەمانەوێت لەم بەشەدا ئاماژەی پێبدەین.

گفتوگۆ کردن لە نێوان دوو کەس یان زیاتر لەسەر ئینتەرنێت، دەکرێت بە شێوەی نووسین یان بە نووسین ودەنگ یان بە نووسین ودەنگ و وێنە بێت.

**دوو جۆری سەرەکی لە گفتوگۆ کردن هەیە:**

**جۆری یەکەم:** گفتوگۆ کردنە لەگەڵ کەسانی ناسراو(هاوڕێ)، کە ئەمە ئەو کەسانەن کە خۆت دەیانکەیتە وباسەکانتان لە بواری تایبەت بە خۆتاندا دەبێت.

**جۆری دووەم:** گفتوگۆ کردنە لە ژورەکانی گفتوگۆدا کە لەم ژورانەدا باسەکان دیاری کراون بۆ ئەو کەسایەتییانە کە مەرج نیە ناسراو بن وهەموو کەسێك بۆی هەیە بەشداری گفتوگۆکان بێت.

ئەو سایت وبەرنامانەی کە گفتوگۆیان پێ دەکرێت زۆرن، بەڵام بڵاوترینیان بەرنامەکانی:

(Paltak Messenger , Msn Messenger , Yahoo Messenger )

ئەمە جگە لە چەندین سایتی تایبەت بە گفتوگۆکردن وەك:

(Kurd Chat، ...) ئێمە لێرە یاهو مێسنجەر Messenger Yahoo وەك نمونەی بەرنامەی گفتوگۆکردن وەردەگرین کە ئەم بەرنامەیە بەکارهێنەری زۆری هەیە، جگە لە ئاسانی بەکارهێنانی.

سەرەتا بۆ دەستکەوتنی بەرنامەی Yahoo Messenger دەتوانین بەهۆی سیدی یاخود راستەوخۆ لە ڕێگەی سایتی (Yahoo)، بەرنامەکە داون لۆد(Download) بکەین. بەم شێوەیە:




پاش کردنەوەی سایتی (Yahoo) کلیك لەسەر Messenger بکەو بەرنامەکە (Download) بکە.

ئێستا تۆ خاوەنی بەرنامەی Yahoo Messenger ی لەسەر کۆمپیوتەرەکەت وئامادەیە بۆ کارکردن.

**تێبینی:**

دەتوانی بەرنامەی (Yahoo Messenger) تەنها بۆ گفتۆکردن لەگەڵ ئەو ئیمەیلانەدا بەکاربێنیت کە لەناو سایتی (Yahoo) دا دروستکراون.

## کردنەوەو بەکارهێنانی بەرنامەی Yahoo Messenge

بۆ کردنەوەی بەرنامەی یاهو مێسنجەر Yahoo Messenger سەرەتا کلیك لەسەر (start) پاشان (All Programs) دوایی لە ناو بەشی (YahooMessenger)دا کلیك لەسەر(Yahoo Messenger) بکە، یاخود هەر لەسەر دیسك تۆپی کۆمپیوتەرەکەت دوو کلیك لەسەر ئایکۆنی (Yahoo Messenger) بکە کە لە وێنەکەدا دیارە.




بەمەش بەرنامەی Yahoo Messenger دەکرێتەوە وەك لەم شێوەیەدا دیارە، کە داوای نوسینی ناونیشانی ئیمەیڵەکە لە Yahoo!ID و وشەی نهێنی لە Password ئینجا کلیك بکە لەسەر Sign in یاهو مێسنجەر دەکرێتەوە، کە ئامادەی کارکردنە.




ئەگەر بتەوێت ئیمەیلی هاوڕێیەکت دابکەیت ئەوا لە لیستی Contact دا کلیک بکە لەسەر Add a Contact بۆکسێك پیشان دەدات لە بۆشایی یەکەمدا نوسراوە Type the person's Yahoo! ID or email address ئیمەیلی ئەو هاوڕێیەت بنووسە کە مەبەستە پاشان کلیك بکە لەسەر Next لە دواییدا بۆکسێکی تر پیشان دەدات لێرەدا تەنها کلیك بکە لەسەر Next وپاشان کلیك بکە لەسەر Finish.

هەرکاتێك هاوڕێ یەکەت لەسەر هێلی YahooMessenger بوو ئەوا هێمای تەنیشت ئیمەیلی هاوڕێکەت (زەرد) دەبێت.

بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵیدا دوو کلیك لەسەر ناوەکەی بکە بۆکسێکی تایبەت بە گفتوگۆ کردن دێت کە لەناویدا نووسینەکەت بنووسە وپاشان کلیك لەسەر Send بکە یان دەست بنێ بە دوگمەی

(ئینتەر) لەسەر کیبۆردەکە نووسینەکەی تۆ دەگاتە هاوڕێکەت و پاشان چاوەڕێ ی وەڵام بکە لەلایەن هاوڕێکەتەوە.

بۆ قسەکردن بەدەنگ یان بەدەنگ وکامێرا لە کاتی بوونیدا دەتوانیت کلیك لەسەر ئایکۆنی Call بکەیت لەگەڵ ئایکۆنی Webcam.

بۆ گفتوگۆ کردن لە ژوورەکانی گفتوگۆدا سەرەتا لەپاش کردنەوەی یاهو مێسنجەر Yahoo Messenger کلیك بکە لەسەر ئایکۆنی Chat وپاشان ناوی بابەتەکانمان بۆ دێت کە جۆری ژوورەکانمان بۆ دیاری دەکات، وەك ئەو ژورانەی باس لە پەروەدە وخوێندن دەکات لە خوێندنگەکاندا، یان ئەو ژورانەی باس لە کاری دارایی دەکەن، یان ..... هتد.



کلیـك لەسـەر بابەتەکـە بکـەو دوو کلیـك بکـە لەسـەر گرووپـی ژوورەکـە بۆکـسێك دەردەکـەوێت وکلیـك لەسـەر Enter Chat بکـە پاش کەمێك دەچیتە ناو ژوورەکەوە بەم شێوەیە:







بـە ئـارەزووی خـۆت دوو کلیـك لەسـەر یـەکێك لـەو ئیمەیڵانـە بکـەو گفتۆگۆی لەگەڵدا بکە.

دوای تـەواو بـوونی گفتوگـۆ دەبێت بەپێ ی هەنگاوانە دەربچیت لە ناو (Yahoo Messenger):

١. کلیك لەسەر لیستی Messenger بکە.

٢. کلیك بکە لەسەر Sign Out.

٣. پاشان کلیك بکە لەسەر Close.

# زانینی زانیاری دەربارەی کەش وهەوا

یەکێکی تر لە سوودەکانی ئینتەرنێت بریتییە لە زانینی زانیاری دەربارەی کەش وهەوا.

چەندین سایتمان هەیە بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە زانیاری بزانین دەربارەی کەش وهەوا یەکێك لەو سایتانە بریتی یە لە سایتی (www.wunderground.com)، گرنگی ئەم سایتە لەوەدایە کە دەتوانێت کەش وهەوای (ڕۆژو شەو)ت پی بڵێت بۆ ماوەی (٧)ڕۆژ واتە یەك هەفتە بەم شێوەیە:

١. بۆ کردنەوەی سایتەکە لە خانەی Address ناونیشانکەی www.wunderground.com بنووسەو کلیك لەسەر Go یان دوگمەی Enter دابگرە ئەم لاپەڕەیەت بۆ دەکرێتەوە.



٢. پاشان لە خانەی Find the Weather for any City, State or Zip Code, or Airport Code or Country. دا ( ناوی ئەو وڵاتە یان ناوی ئەو شارە یان کۆدی ئەو وڵاتە یان کۆدی فڕۆکەخانەی ئەو وڵاتە ) بنووسە کە دەتەوێت کەش وهەواکەی بزانیت بۆ نمونە ئەگەر لێرەدا ناوی وڵاتی iraq بنووسیت لەپاشان کلیك لەسەر ئایکۆنی Fast Forecast بکە یان دوگمەی Enter دابگرە، ئەم لاپەڕەیەت بۆ دەکرێتەوە:



٣. ئینجا کلیك لەسەر ئەو شارە بکە کە دەتەوێت کەش وهەواکەی بزانیت، وەك کلیکردن لەسەر شاری سلێمانی، لاپەڕەیەکی تر دەکرێتەوە بەم شێوەیە:




کە لێرەدا تەنها کەش وهەوای پێنج ڕۆژت پێ دەڵێت بەڵام لاپەڕەکە بەهۆی دوگمەی (Page Down)، یان بەهۆی ماوسەکەوە بۆ لای خوارەوە ڕاکێشە، دەبینیت کەش وهەوای حەوت ڕۆژ لەگەڵ شەوەکانیدا واتە یەك هەفتەی بۆ نووسیویت بەم شێوەیە:

| 04:00 :تحديث AM ADT on êèءêè 20, 2006 | |
|---|---|
| | الثلاثاء<br>102 :صافية. عليا °F / 39° C ريح WNW 8 mph. / 14 km/h. |
| | ليلة الثلاثاء<br>71 :صافية. دنيا °F / 22° C 8 ريح شمال شرقي mph. / 14 km/h. |
| | الأربعاء<br>104 :صافية. عليا °F / 40° C 8 ريح غرب mph. / 14 km/h. |
| | ليلة الأربعاء<br>73 :صافية. دنيا °F / 23° C ريح ENE 6 mph. / 10 km/h. |
| | الخميس<br>105 :صافية. عليا °F / 41° C ريح WSW 8 mph. / 14 km/h. |
| | ليلة الخميس<br>75 :صافية. دنيا °F / 24° C ريح ENE 6 mph. / 10 km/h. |
| | الجمعة<br>104 :صافية. عليا °F / 40° C ريح WSW 11 mph. / 18 km/h. |
| | ليلة الجمعة<br>75 :صافية. دنيا °F / 24° C 4 ريح شمال شرقي mph. / 7 km/h. |
| | السبت<br>104 :صافية. عليا °F / 40° C ريح WSW 11 mph. / 18 km/h. |
| | ليلة السبت<br>77 :صافية. دنيا °F / 25° C ريح ENE 8 mph. / 14 km/h. |
| | الأحد<br>105 :صافية. عليا °F / 41° C ريح WNW 8 mph. / 14 km/h. |
| | ليلة الأحد<br>77 :صافية. دنيا °F / 25° C ريح ENE 8 mph. / 14 km/h. |
| | الاثنين<br>105 :صافية. عليا °F / 41° C ريح NW 11 mph. / 18 km/h. |
| | ليلة الاثنين<br>77 :صافية. دنيا °F / 25° C ريح NW 11 mph. / 18 km/h. |

# ڤایرۆسی کۆمپیوتەر Computer Virus

لە کاتێکدا کە کۆمپیوتەر وئینتەرنێت بۆتە پێویستییەکی ڕۆژانەو تێکەڵ بوونی بە ژیانی مرۆڤەوە لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا جێگای خۆی کردۆتەوە، بەڵام ئەوەی سەیرە ئەم ئامێرە سوود بەخشە بێ دەردوبەلا نییە وکەسانێك هەن شارەزان لە بواری داڕشتنی بەرنامەی کۆمپیوتەر کۆسپ دادەنێن بۆ تێکدان ولەکارخستنی.



ڤایرۆسی کۆمپیوتەر زیندەوەرێك نییە بچێتە ناو ئامێرەکەوەو تووشی نەخۆشی بکات بەڵکو بریتییە لە بەرنامەیەکی دروستکراو کە دانراوە بۆ لەکارخستنی سیستمی کۆمپیوتەر کە

ئەویش کاتێك رودەدات کە کۆمپیوتەرەکە لە کاردا بێت واتە بە کردنەوەی کۆمپیوتەرەکە ڤایرۆسەکە کاری خۆی دەکات کاری ڤایرۆسەکە مەرج نی یە کۆمپیوتەرەکە لە کار بخات هەندێك جار دەبێتە هۆی سڕینەوەی فایلاتی جۆراوجۆرەکانی بەرنامەکان یاخود دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی سیستمی کۆمپیوتەرەکەو چەندەها کێشەی تر کە توشی کۆمپیوتەرەکەی دەکات.




بەپێی راپۆرتێك لە کۆمپانیای (سوفوس) بۆ دروست کردنی بەرنامە بۆ بەرگری کردن لە ڤایرۆس سالآنی رابوردودو ژمارەیەکی زۆر ڤایرۆس بلاوبووتەوە، بۆ نموونە لە سالی ٢٠٠١ دا ژمارەی ڤایرۆس ١٢٠٠٠ هەزار بووە ، ڤایرۆسی Nimda لە پێشەوەی ئەو ڤایرۆسانە بووە کە بلاوبووەتەوە جگە لە ڤایرۆسی Sircam.

وە زۆر لە ڤایرۆسەکان بە ناوی هونەرمەندی سینمایی و یاریزانە بەناوبانگەکانن، یان بەناوی خۆشم ئەوێیت I Love You ،...هتد.

ئەمانــە كۆمــەڵێك ڤایرۆســی بــەناوبانگن کــە لــە ڕێگــەی ئینتەرنێتەوە دەگاتە کۆمپیوتەرەکان.

ئـەوەی جێگـای سـەرنجە ئایـا دەبێـت هـۆی چـی بێـت؟ لـە سـەردەمی کۆمپیوتـەرو ئینەرنێتـدا کەسـانێك هەبن کـاتی خۆیـان بـە فێرۆبدەن بۆ کۆسپ دانـان لەبـەردەم ئـەم زانستەدا یـاخود پەیوەندی هەیـە بـە هەنـدێك لـە کۆمپانیاکـان کـە لـەپێناوی بەرژەوەنـدی مـادی خۆیانەوەیـە، ڤایرۆس لەڕێگـەی ( ئینتـەرنێت وفلاش دیـسك و سـی دی)یەوە بڵاودەبێتەوە.

وە دەبێت هەمیشە کۆمپیوتەرەکەت بەرنامەی ئەنتی ڤایرۆس (AntiVirus)ی نوێی تێدا بێت بۆ ئـەوەی کۆمپیوتەرەکـەت بـە دوور بێت لە زیانی ڤایرۆس.

# ڕاهێنان

*** لایەنی تیۆری:**

**پ١) باسی جۆرە سەرەکییەکانی گفتوگۆکردن بکە؟**

**پ٢) سوودی ئەم ئایکۆنانە چییە؟**

١. Forward  ٢. Refresh  ٣. Search

*** لایەنی پراکتیکی:**

**پ١) ئیمەیڵێك دروست بکە بە ناوی خۆتەوە لە سایتی Yahoo دا.**

**پ٢) نامەیەك لەگەڵ وێنەیەك بنێرە بۆ هاوڕێکەت.**